زنجیره كتێبی ڕێكخراوی ئینتەرنێت و كۆمپیوتەری كوردستان 15

# مایکرۆسۆفت پەبلیشەر

## Microsoft Publisher 2003

**بۆکاری دیزاین**

یەکەمین کتێب بە کوردی دەربارەی مایکرۆسۆفت پەبلیشەر

**بەرگی یەکەم**

**نووسینی: سەرکەوت پێنجوێنی**

ناوی کتێب : مایکرۆسۆفت پەبلیشەر – بۆکاری دیزاین

سیدی کتێبەکە: مایکرۆسۆفت ئۆفیس پرۆڤیشناڵ **2003**

ناوی نووسەر: سەرکەوت پێنجوێنی

بەرگی : یەکەم

سەرپەرشتیاری چاپ و چاپکردن : چاپخانەی گەنج

زنجیرە کتێبی ڕێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپوتەری کوردستان **kico 15**

شوێن و ساڵی چاپ: سلێمانی – **2006**

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

تیراژ: **1000** دانە



ژمارەی سپاردن لە وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان (     )

**كتێبەكەم دەكەمە دیاری بۆ :**

@ ئەو كەسانەی نیشتیمانی خۆیان بەدڵ و گیان خۆشدەوێت.

@ باوك و دایكی زێدە ئازیزم.

@ هاوڕێیانی خۆشەویست و ئازیزم كاك عەلی و كاك فوئاد .

@ ئەندامانی رێكخراوی kico .

@ بەتۆی خوێنەرو تینووی زانست.

## لەناوسیدی

## كتێبی مایكرۆسۆفت پەبلیشەر

1-مایكرۆسۆفت ئۆفیسی پرۆڤیشناڵی 2003

2- بەرنامەی Adobe Reader 7.5

3- بەرنامەی Cute PDF

4- قاڵب بۆ پەبلیشەر

5- فۆنت



# پێشەكی :

بەرنامەی **Microsoft Publisher** بەرنامەیەكی دەوڵەمەندوكارایە, لەبەرئـــــــــەوەی بەرنامەیەكی فرە كارەو بەهۆیەوە دەتوانین زۆر شت جێبەجێ بكەین.

ئەم بەرنامەیە تایبەتە بە كاری دیزاین و نووسین , بۆئەمەش مایكرۆسۆفت هاتووە كۆمەڵێك قاڵبی ئامادەكراوی بۆ داناویت و دەتوانیت بەئارەزووی خۆت دەستكاری ئەو قاڵبانە بكەیت و بەدڵی خۆت دایانرێژیتەوە.

گرنگترین كارەكان ,كە لەناو ئەم بەرنامەیەدا دەكرێن, ئەمانەن:(دیزاینی گۆڤار–كتێب– رۆژنامە – سایت – كارتی كەسی – كەتەلۆگ).

ئێمە لەم بەرگەدا كۆمەڵێك كارمان باسكردووە بەوهیوایەی لەبەرگی دووەمدا ئەوەی ماوە باسیان بكەین, لەبەرگی دووەمدا زیاتر تیشك دەخەینەسەر باسكردنی چۆنییەتی دیزاینی رۆژنامەو سایت.

لێرەدا دەمەوێت ئەو راستییە بەئێوە بڵێم ,كەمن لەم كتێبەمدا سوودم لەهیچ سەرچاوەیەكی تر جگە لە مێشك و زانینی خۆم وەرنەگرتووە, چونكە خۆتان دەزانن سەرچاوە زۆر كەمە لەسەر پەبلیشەر , بۆیە من لەم كتێبەو كتێبەكانی ترمدا هەوڵمداوە پشت بە زانین و بەكارهێنانەكانی خۆم بۆبەرنامەكان ببەستم لەنووسینی كتێبدا .

بۆزانیاریتان من لەرێگەی ئینتەرنیتەوە لەسەدا شەستی ئۆفیسی 2007م داونلۆد كردووە , هەوڵ دەدەم دوای ئەوەی هەمووییم داونلۆد كرد كتێبێكی تێرو تەسەل لەسەر ئەو ئۆفیسە پێشكەش بە ئێوەی تینوو بە كۆمپیوتەر بكەم.

بەوهیوایەی سوود لـــــــەم كتێبە وەربـــگرن و هەر پرسیارێكتان هەیە دەیـــخەمە سەرچاوان و بەم ناونیشانانە پەیوەندیم پێوە بكەن:


**رێكخراوی ئینتەرنێت و كۆمپیوتەری كوردستان kico**

**سلێمانی – بازاڕی هەورامان – پشت بازاڕی خەفاف**

Mobile: 07702220060

Tel: 0532136130

Email: sarkawt@paris.com

# لـــــەم کـــتێبەدا

## دەربارەی بەرنامەکە:

بەرنامەی Microsoft Publisher 2003 بەرنامەیەکی تایبەت بەکاری دیزاین و نووسینە.

ئەم بەرنامەیە کۆمەڵێك کاری زۆرمان بۆ جێبەجی دەکات لەوانە دیزاینی سایت و رۆژنامەو گۆڤارو کارت و پۆستەرو کتێب و کاروباری ناو نووسینگەو فەرمانگەومالّ هەروەها لە زۆر نووسراوو دروستکردنی کلێشەی جۆراوجۆردا بەکاردێت.

## دابەزاندنی بەرنامەکە :

گومانی تێدا نییە،کە مایکرۆسۆفت پەبلیشەر لەگەڵ تاقمی ئۆفیسدایە، لەم کتێبەدا ئێمە باس لە مایکرۆسۆفت پەبلیشەری 2003 دەکەین،کە لەگەڵ ئۆفیسی 2003دا دانراوە.

هەر کە ئۆفیسی 2003ت دابەزاند، ئەوا بزانە بەرنامەی پەبلیشەرت هەیە .

دوای دابەزاندنی ئۆفیس دەچینەسەر start ئینجا programs لەوێدا دەچینە سەر Microsoft tools ... سەرنج بدە ئەوە بەرنامەی

ناوبراوە،كە دەتوانین كلیكی لای راستی لەسەر بكەیت و copy هەڵبژێریت

و پاشان لەسەر دیسكتۆپ paste بكەیت وەكو شۆرتكەت.



ئەوەتا لەسەر دیسكتۆپ شۆرتكەتی بەرنامەكەمان دانا.



ئەو کارو فرمانانەی ئەم بەرنامەیە بۆمان جێبەجێ دەکات زۆر نزیکە لە کارەکانی بەرنامەی Microsoft Word، واتە ئەگەر تۆ شارەزاییەکت لەبارەی بەرنامەی وێردەوە هەبێت، ئەوا بەئاسانی دەتوانیت کار بە بەرنامەی مایکرۆسۆفت پەبلیشەر بکەیت، ئەمە وەك کارو فرمان وەکو شێوەی دەرەوەش واتە رووکاری ئایکۆن و ئامرازەکانی پەبلیشەر لەزۆر رووەوە هەر لەبەرنامەی word دەچێت، کەواتە دەگەینە ئەو ئەنجامەی فێربوون و کارپێکردنی مایکرۆسۆفت پەبلیشەر زۆر خۆش و ئاسانە .

## ناساندنێکی بەشەکانی بەرنامەی Microsoft Publisher

سەرەتا شتێك لەسەر رووکاری گشتی بەرنامەکە باس دەکەین، پاش ئەوەی کلیکی ئایکۆنی بەرنامەی Microsoft publisher ت کرد ئەم رووکارەت بۆدێت:

لەگەڵ کردنەوەی پەبلیشەردا ئەم رووکارەمان بۆدەردەکەوێت:



# راڤەكردنی لیستی ئامرازو بەشەكانی بەرنامەی پەبلیشەر

**شریتی ناونیشان:**

پێكدێت لەناوی فایلەكەت و ناوی بەرنامەكە ,كەلەسەرەوەی بەرنامەی پەبلیشەردایە:




**شریتی لیستەكان:**

پێكدێت لەو كۆمەڵە فەرمانەی لەناو بەرنامەكەدا هەیە , لەچەند لیستێك پێكهاتووە فەرمانەكانیان جودایە لەیەكتر.

File Edit View Insert Format Tools Table Arrange Window Help

فایل / File

نووسین/ Edit

پیشاندان/ View

ئیزافەكردن/ Insert

رێكخستن/ Format

ئامرازەكان/ Tools

خشتە/ Table

رێككردن/ Arrange

ویندۆ/ Window

ڕێنمایی / Help

**شریتی ئامرازەكان** Toolbar : پێكهاتووە لەكۆمەڵێك ڕەمز هەریەكەیان كارێك جێبەجێ دەكەن, دەتوانیت فەرمانی تر بەماوسەكە بهێنیت لەوێدا دایبنێیت.



**شریتی ئامرازەكانی ڕێكخستن:** كۆمەڵێك ڕەمزە بەكاردێت بۆ ڕێكخستنی جۆراوجۆری نووسین , وەكو فۆنت و قەبارەكەی و ڕەنگ و ڕێكخستنی پەرەگرافەكان و ... هتد.



**ڕاستە :**

ڕاستەیەكی ئاسۆییە بە ئینچ و سانتیمەتر پێوانەت بۆدەكات.




**شریتی هێنان و بردن** Scroll Bars : بەكاردێت بۆ دەركەوتنی لای ڕاست و چەپی پەیجەكانت,كەوتۆتە خوارەوەی بەرنامەكە.



**شريتى** Status Bar: كەوتۆتە خوار شريتى سكرولّ بارِو تيايدا زانيارى لەبارەى ژمارەى پەڕەو پەرەگراف و زانيارى تر هەيە.



## رێكخراوى ئينتەرنێت و كۆمپيوتەرى كوردستان

kico

5سالّ ئەزموون لەكارى كۆمپيوتەرو ئينتەرنێت ناسى

يەكەمين رێكخراوى كوردى تايبەت بە لێكۆلّينەوە لەبوراى ئاى تى ...

**پيشەنگ لە دەرچواندنى كتێب و گۆڤارو سيدى ...**

@ بۆناردنى بابەت وداواكارى و رەخنەو پێشنيار بەم ئيمەيلّە

پەيوەنديمان پێوە بكە:kicoweb@yahoo.com

# نووسین لەپەڕەیەکی بەتاڵدا

1- بەرنامەی پەبلیشەر بکەرەوەو پاشان بچۆ لەشریتی ئامرازەکان کلیکی ڕەمزی پەڕە سپییەکە بکە بۆئەوەی پەڕەیەکی نوێت بۆ بکرێتەوە , یان بچۆ بۆ File> New .




2- ئینجا ئەم پەڕە بەتاڵەت بۆدێت و دەتوانیت شتی تیابنووسیت,دەتوانیت لەرێگەی ئەم قاڵبانەوە قاڵبی ئامادەکراو وەربگریت.



3– پاشان بچۆ لە شریتی Objects لای دەستە چەپ تێکستێك 

لەناو پەڕە بەتاڵەکەت دابنێ بۆئەوەی بتوانیت بنووسیت لەناو پەڕەکەدا:



4– ئیستا ئەوەی دەمانەوێت دەینووسین و پاشان ڕێکیان دەخەین , نووسین لێرەدا وەکو بەرنامەی word وایە , بەڵام پەبلیشەر پەڕەکانت یەکە بەیەکە بۆ ناهێنێتە خوارەوە بەڵکو لێرەدا بەژمارە پەڕەکانت بۆ دادەنێت, ئەگەر وتارو بابەتی درێژ یان کتێبمان هەبوو لەناو تێکستەکە دایدەنێین و خۆی لە لاپەڕەی یەکەوە بۆ کۆتایی پەڕەکانت بۆ دادەنێت.



5- بۆئەوەی نووسینەکەمان گەورە بکەین , سەرەتا دەچین سەلێکتی ئەو نووسینانە دەکەین , پاشان لەسەر کیبۆردەکە دەست دەنێین بە CTRL و دووگمەی (د) ی عەرەبی بەیەکەوە, دەست هەڵناگرین تا نووسینەکەمان بۆ ئەو قەبارەیە گەورە دەکات, کە پێویستمانە, یان دەتوانین نووسینەکەمان سەلێکت بکەین و پاشان لە شریتی ئامرازەکانی ڕێکخستن قەبارەی پێویستی بۆ هەڵبژێرین.

**تێبینی** : بۆ ناونیشانەکانیش دەتوانرێت هەمان کردار جێبەجێ بکرێت.

سەرنج بدە:



6– ئیستا پێویستە پەرەگرافی نووسینەكانمان رێكبخەین, بۆئەم مەبەستە دەچین سەرجەم نووسینەكەمان لەناو ئەو دوو پەرەیە سەلێكت دەكەین, پاشان كلیكی لەشریتی ئامرازەكانی رێكخستندا یەكەمین رەمز لەم رەمزانە كلیك دەكەین واتە Justify .




هەر بۆ ئەم كارە دەتوانیت بچیتە سەر Format>paragraph ولەلیستی Genaral وە Justified هەڵبژێرەو ok بكە , رێگای تریش هەیە پێویست ناكات باسی بكەین.

# دانانی وێنە لەناو تێكستدا

بۆئەوەی وێنەیەك لەناو ئەم تێكستەدا دابنێین واتە تێكستی پێشووئەم هەنگاوانە دەگرینەبەر:

1–تێكستەكە دەكەینەوە:



2– لەشریتی objects دا لەلای دەستەچەپ كلیكی ئەم ئایكۆنە بكەو پاشتر ئەم فەرمانەت بۆدێت Picture from File و كلیكی بكە:



3– نیشانەی ماوسەکەمان دەبێتە نیشانەی زائید+ , بۆیە پێویستە بچیت لەناو تێکستەکە کلیکێك بکەیت , تاوەکو بۆکسی وێنە بکرێتەوە:




لێرەدا ئەو وێنەیەی بۆ بابەتەکەمان دەشێت دەدۆزینەوە پاشان دەبڵ کلیکی دەکەین بۆ دانانی لەناو تێکستەکەدا , یان ڕێگایەکی تر هەیە ,کە سەرەتا وێنەکە سەلێکت بکەو پاشان کلیکی Insert بکە.

4– ئەوە وێنەکەیە , کەمێك گەورەی دەکەین و لەجێگایەکی شیاو دایدەنێین:



5– سەرنج بدە وێنەکەمان لەکوێیدا داناو خۆی جێگای بۆ خۆی کردەوەو تێکستەکانی خستە ئەولاتری , بەمەش دیزاینەکەمان گۆڕدرا بۆ شێوەیەکی جوان و هونەریتر.




6– بۆئەوەی وێنەکە لەناو نووسینی ناو تێکستەکەدا بگونجێنین دەبێت شریتی picture بەکاربهێنین, بەتایبەتی فەرمانی Text Wrapping



# خەزنكردنی پەڕەكان

1– بۆ خەزنكردنی پەڕەكان دەچینەسەر File> save یان لەسەر شریتی ئامرازەكان كلیكی ئەم ئایكۆنەی سەیڤكردن دەكەین 

2– ئەم بۆكسەمان بۆدێت:

لێرە درایڤی خەزنكردن دیاری بكە




لێرە ناوێك لە فایلەكە بنێ

لێرە جۆرە فۆرماتی فایلەكە دیاری بكە

بۆ نووسین ئەم فۆرماتە واتە

Publisher Files باشە.

دوا هەنگاو كلیكی save بكە.

**تێبینی** : بۆ خەزنکردنی فایلێکی پیشتر سەیڤکراولەناو لیستی file دا کلیکی save as بکە.

یان ئەگەر ویستت زوو زوو ئەو پەڕەیەی کاری تێدا دەکەیت خەزنی بکەیت کلیکی ئەم نیشانەیەی خەزنکردن بکە: 

# چاپکردنی پەڕەکان

بۆ چاپکردنی Print ئەو پەڕانەی دەتەوێت ئەم کارانە بکە:

1– پەڕەکە بکەرەوە لەلیستی File دا Print کلیك بکە , یان لەسەر کیبۆردەکەت دەست بنێ بەدووگمەکانی ctrl+p .



2– پاشان ئەم بۆکسەمان بۆدێت :




**تێبینی** : پێویستە پرێنتەرەکەت بە کۆمپیوتەرەکەت تەعریف کردبێت و پاشان هەڵکرابێت.

3– ئەگەر ویستمان بەباری پانی پەڕە چاپ بكەین , ئەوا دەچین لەبۆكسی print دا كلیكی Properties دەكەین:




ئینجا ئەم بۆكسە دێت و دەچین كلیكی Basics دەكەین:




پاشان لێرەدا Landscape دیاری دەكەین و لەخوارەوە كلیكی ok دەكەین.

دواجار ئەم بۆکسەمان بۆدێتەوە کلیکی ok دەکەین:




**ئامادەکارییەکی گرنگ :**

1– لە لیستی File دا کلیکی Print دەکەین و ئەم بۆکسەمان بۆدێت و لەوێشدا کلیکی Advanced Print Settings دەکەین.



2– ئەم بۆكسە دێت :



# دامەزراندنی پەڕەكان

1- بچۆرەسەر File و كلیكی Page Setup بكە.




2- لێرەدا ئەو جۆرە ستایلە دیاری بكە , كە دەتەوێت كاری تێدا بكەبت:



# دروستكردنی خشتە

1–پەڕەیەكی نوێ بكەرەوەو بچۆرە سەر Table و كلیكی Insert پاشان Table بكە:




2– ئەم بۆكسەت بۆدێت و ژمارەی هێڵی پانی و درێژ دیاری بكە بۆنموونە 6بە6




لێرەدا شێوە جۆراوجۆرەكانی خشتەكان هەڵبژێرەو پاشان كلیكی ok بكە .

لێرەدا ئاراستەی نووسینی خشتەكە دیاری بكە.

3– خشتەكەمان بەمجۆرە بۆ دەردەكەوێت , ئەوەی دەمانەوێت تیایدا دەینووسین,بۆنموونە ئەم خشتەیە تایبەتە بە ئیشووكاری ئیداری ڕێكخراوی ئینتەرنێت و كۆمپیوتەری كوردستان:

| ناوی ئەندام | پلەكەی | ناونیشان | سالی بوونە ئەندام | پیشە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| سەركەوت پێنجوێنی | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | |
| [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | |
| [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | |
| [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | |
| [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | |

دەتوانین ئیستا بچینەوە جارێكی تر لیستی Table كلیك بكەین و ئەم لیستەمان بۆدێت:




* بۆ ئیزافەكردنی كۆڵەم و ڕۆی تر.

* بۆ سرینەوەی كۆڵەم و ڕۆكان.

* بۆ سەلێكت كردنیان.

* بۆ گۆڕینی شێوە فۆرماتی خشتەكە.

# سەرەتای کارکردن بەبەرنامەی Publisher

یەکەمجار، کەبەرنامەکە دەکەیتەوە ئەم رووکارەمان بۆدێت، تۆ یەکسەر کلیکی

ئێرە بکە، کە نووسراوە publications for paint




ئینجا ئەم رووکارەمان بۆدێت، کە کۆمەڵێك قاڵبی ئامادەکراوی تێدایە و

دەتوانین بۆ دروستکردنی بەرگ و پۆستەرو نووسین و کلێشە و زۆر شتی تر

سوودی لێوەربگرین، ئیستا نموونەیەك وەردەگرین، بۆنموونە ئەمە هەڵدەبژێرین:



لێرەدا بەرلەوەی بچینە سەر قاڵبە حازرەکە پێویستە لێرەدا کلیکی ok بکەین:



ئەمەش قاڵ... تێکست

ناتوانیت هیچ نووسینێک بنووسیت، چونکە وەکو بەرنامەی word نییە، تاتوانیت لە,سەر پەڕەیەکی ئاسایی ئەوەی دەتەوێت بینووسیت، بەڵام ئەوەش بزانە بەرنامەکە خۆی تێکستی بۆداناوێت،ئەگەر تێکستت ویست بۆ نووسین لە جێگەیەکدا ئەوا بەکلیك کردن لەم ڕەمزە تێکست دروست دەبێت. 

ئەم قاڵبەمان هەیە و دەتوانین بۆ زۆر شت بەکاری بهێنین , بۆنموونە ئێمە لێکۆڵینەوەیەکمان ئەنجامداوە دەمانەوێت بەرگێکی جوانی بۆ دروست بکەین :



سەرەتا ئەم وێنەیە لادەبەین ئەویش بە سەلێکت کردنی وێنەکەو پاشان لەسەر کیبۆردەکە دەست دەنێین بە دووگمەی Delete .

ئينجا لەتێكستكەى خوارەوە ناونيشانى لێكۆڵينەوەكەمان دەنووسين بۆنموونە ئەمە ناونيشانى لێكۆڵينەوەكەمانە : **حكومەتى ئەليكترۆنى لەكوردستان** دێين ئەم نووسينە سەلێكت دەكەين و پاشان لەسەر كيبۆردەكە دەست دەنێين بەدووگمەى Delete بۆ ئەوەى ناونيشانەكەمان لەناو تێكستەكە بنووسين , پاشان لەخوارەوە واتە لە تێكستى دووەمدا ناوى نووسەرى لێكۆڵينەوەكەو ساڵەكەى دەنووسين:



تێبينى زۆر گرنگ: لە ناو بەرنامەى پەبليشەردا كاتێك ژمارە دەنووسين دەيكات بە چوارگۆشە بۆمان , بۆ چارەسەركردنى دەبێت ئەو ژمارانەى بوونەتە چوارگۆشە سەلێكت بكەين و بچين لەناو ليستى فۆنتەكان فۆنتى Arial ى ئينگليزى بۆ هەڵبژێرين , ئينجا فۆنتەكان چاك دەبنەوە .

ئەوە چووین ژمارەکانمان سەلێکت کرد :



ئەوا دەچین فۆنتی ئاریەڵی Arial ی بۆ هەڵدەبژێرین:

تێبینی : هەموو فۆنتەکانی Arial ی بۆ دەبێت.




سەرنج بدە چۆن فۆ



پاشان کەمێك فۆنتی ناونیشانەکەمان گەورە دەکەین , دواتر کەمێکیش تێکستی ناونیشانەکە دەبەینە سەرەوە:



دەبێت سەر ... ڕاو یان ئەوشوێنە بنووسین , کە لێکۆڵینەوەکەی ئەنجامداوە , بۆنموونە دەنووسین :

بەشی دیسکی داتا

سەرەتا دەچین کلیکی لای ڕاست لەسەر هێدەکەی سەرەوە دەکەین و پاشان Add Text کلیك دەکەین, ئینجا ئەوەی دەمانەوێت تیایدا دەینووسین:



ئەوەتا لەناو هێدەکەدا ئەوەی ویستمان نووسیمان:



ئیستا رەنگی هێدەکەی سەرەوە بەئارەزووی خۆمان دەگۆڕین, بۆئەم مەبەستە لەلای دەستە چەپمانەوە کلیکی color schemes دەکەین یەکسەر کۆمەڵێك رەنگ دێت بەئارەزووی خۆمان ئەوەی بەلامانەوە جوانە دیاری دەکەین:



دوای تەواوبوون لەو کردارانە , بۆنموونە دەمانەوێت چوارچێوە یان رەنگێکی جوان بدەین بە ناونیشانەکەمان , سەرەتا دەچین دەبڵ کلیك لەسەر تێکستی ناونیشانەکەمان دەکەین بۆ ئەوەی ئەم بۆکسەمان بۆ بەدەربکەوێت:



پاشان لێرەشدا کلیکی Border Art دەکەین و دەبینین کۆمەڵێك چوارچێوەی ئامادەکراو دانراوە , یەکێکیان سەلێکت دەکەین و ئۆکەی دەکەین, بۆنموونە ئەم جۆرەیان هەڵدەبژێرین.



ئیستا, كە ok ی دووەم دەكەین ناونیشانەكەمان ئاوەها دەردەكەوێت:



دەتوانین باكگراوندێك بدەینە تێكستی ناونیشانەكەمان, بۆئەم كارە بەهەمان شێوەی پێشوو دەبلّ كلیك لەسەر تێكستی ناونیشانەكەمان دەكەین , ئەم بۆكسەمان بۆدێت لەبەشیcolor دا ئەو رەنگەی دەمانەوێت بۆی دیاری دەكەین.



دواجار ok دەكەین و ئەمەش باكگراوندەكەمانە , كە بۆی داناوین:



* ئەگەر ویستمان وێنەیەك یان لۆگۆیەك بۆئەم بەرگە دابنێین , ئەوە لەلای دەستە چەپەوە دەچین  كلیكی رەمزی Picture Frame دەكەین و پاشان ئەم بەشانە دێن و كلیكی Picture from file دەكەین و ئینجا نیشانەی + یێك دێت و لەناو پەڕەی بەرگەكە یەك كلیك دەكەین بۆ هێنانی وێنە .



پاشان ئەم تێکستە دەکرێتەوەو ئەو وێنەیەی دەمانەوێت سەلێکتی دەکەین و کلیکی Insert دەکەین بۆهێنانی:



ئەوە وێنەکە هاتووەو لەچوارچێوەی تێکستێکدایەو بەئاسانی دەتوانین لەکوێمان بوێت داینێین, بۆنموونە لە خوار هێدەکەوە دایدەنێین , بۆئەم مەبەستە بەماوسەکەت وێنەکە رابکێشە واتە Drag ی بکەو لەشوێنی مەبەستدا داینێ .



لەهەنگاوی کۆتاییدا ئەنجامی کارەکەمان save دەکەین , بۆ ئەمەش دەچین کلیکی File دەکەین و Save کلیك دەکەین, یان لەشریتی ئامرازەکان کلیکی ئەم رەمزە دەکەین :





دواتر ئەم بۆکەسەمان بۆدێت:



ناوێك لێرە بنووسەو دواتر کلیکی Save بکە:

بۆئەوەی بەتەواوەتی و جوانی کارەکەت ببینیت کلیکی print preview بکە:



ئاوەها دەیبینیت:



بۆ زیاتر جوانكردنی بەرگەكە ,دەتوانین لەناو بەرنامەی پەبلیشەردا چەند تایبەتمەندییەكی تری بۆ ئیزافە بكەین , بۆنموونە ئیستا ئاستی دانانی بەشەكانی بەرگەكەمان دەگۆڕین , واتە دیزاینەكەی دەگۆڕین , بۆئەمەش لەلای دەستە چەپ واتە لە شریتی Task pan كلیكی فەرمانی Quick Publication Options دەكەین:



راستەوخۆ ئەم قاڵبانە دێتە پێش چاوان و ئیستا کلیکی ئەمەیان دەکەین بزانین چ ئەنجامێکمان پێدەدات:



سەرنج بدە چۆن ناونیشانەکەی هەڵگێڕاوەتەوەو دیزاینەکەی گۆڕیوە , دەتوانین زۆر بەئاسانی دەستکارییان بکەین و ڕێکیان بکەینەوە.

بۆنموونە بە دەستکاری کردنی تێکستەکان ئیشەکەمان ئاوها لێکرد:



لەهەنگاوێكی دیكەدا دەڕۆین بۆ دانانی باكگراوند بۆ تەواوی پەڕەكەمان,

بۆئەم كارە پێویستە لە بەشی سەرەوە ,كە نووسراوە

Quick Publication Options ی یەكەم نەك دووەمیان, كلیكی ئەم

نیشانەی سەهمە گەورەیە بكەین تا لیستی مەبەستدار دێتە بەردەمان, پاشان

كلیكی Background دەكەین:



ئەم شێوانە دەردەكەون , كلیكی كامیان بكەین دەبنە باكگراوندی بەرگەكەمان.

بۆنموونە كلیكی ئەم جۆرەیان دەكەین:




سەرنج بدە چۆن رەنگی باكگراوندەكەمان گۆڕدرا.

# دیزاینی پەیجەکانی گۆڤار بەبەرنامەی
# Microsoft Publisher 2003




یەکێك لـە تایبەتمەندییەکانی بەرنامەی مایکرۆ سۆفت پەبلیشەری 2003 ئەوەیە ,کە ئاسانکاری زۆری داناوە بۆکاری دیزاین بەتایبەتی دیزاین کردنی پەڕەکانی گۆڤارو رۆژنامە.

لـەوانەش وەك:

1- کاتێك لـەناو پەڕەیەکدا چەند تێکست یان کۆڵمێکت هەیەو دەتەوێت وێنەیەك لـەناویاندا دابنێیت , یەکسەر بەئۆتۆماتیکی بەرنامەکە ئەو وێنەیە لـەناو تێکستەکە وادادەنێت ,کە نووسینەکان بەدەوری خۆیدا دابەش دەکات.

2- کۆمەڵێك قاڵبی حازری تێدایە ,کە دەتوانرێت دەستکاری بکرێت.

3- پەیجەکانت دەکەیت بە JPEG و PDF .

4- پاڵپشتی رەنگەکانی CMWK دەکات.

5- تایبەتمەندێتی گەڕان SEARCH و FIND و REPLACE ی بۆ ئیزافەکراوە.

ئیستا باس لـە دیزاین کردنی پەڕەکانی گۆڤارێك دەکەین, کە بەبەرنامەی پەبلیشەر دیزاین کراوە.

1– بۆنموونە دەمانەوێت پەڕەیەکی گۆڤاری وێب دیزاین بکەین , سەرەتا دەچینەسەر بەرنامەی پەبلیشەرو پەڕەیەکی نوێ دەکەینەوە, بۆئەم مەبەستە کلیکی ئەم ڕەمزە دەکەین واتە New , یان دەچینەسەر File و New کلیك دەکەین:



2–هەرکلیکمان لە New کرد یەکسەر لـەلای دەستە ڕاست ئەم پەڕە بەتاڵەمان دێتە پێش چاوان , ئیستا هیچ مەکە تەنها لـەسەر کیبۆردەکەت دەست بنێ بە Ctrl+Mبۆ ئەوەی هیدەرو فوتەر بۆسەرو خواری پەڕەکەت دابنیێت:

رەنگى پشت پەڕەكە بوو بەرەنگى زەرد واتە ئيستا دەتوانين

Header and Footer دابنێن بۆ پەڕەكەمان:



پاشان دەچينەسەر ليستى view و لەويشدا كليكى Header and Footer دەكەين:



3- سەرنج بدە بۆشايى بۆداناويت تا هيدەرو فووتەرەكەتى تێدا دابنێيت :



4- سەرەتا هيدەرەكەمان دادەنێين,بۆئەم كارە دەچين هێدێكى جوانى حازر دەهێنين و خۆمان دەستكارى دەكەين ,بەوجۆرەى لەگەڵ رەوتى بلاْوكراوەكەماندا دەگونجێت دايدەنێين.

بۆئەم هەنگاوە دەچينەسەر Insert و كليكى فەرمانى Design Gallery Object دەكەين.



5- یەكسەر ئەم رووكارەمان بۆدێت و بەئارەزووی خۆمان هێدێك دیاری دەكەین .بۆنموونە ئەمەیان هەڵدەبژێرین و كلیكی دەكەین , بۆدابەزاندنی دەبڵ كلیك لەسەر هێدەكە بكە, یاخود دەتوانیت كلیكی Insert Object بكەیت.



6- بەشێوەیەكی هەرەمەكی هێدەكە دێتە ناو پەڕەكەتەوە ئیستا پێویستە بە راكێشان لەیەكێك لەم چوار سووچەوە بچووكی بكەینەوە:



7– ئەوەتا بچووکمان کردەوەو ئیستا تێکستی هێدەکە واتە ئەمەیان پڕ بەپڕی ئەو هێدە دادەنێین واتە تێکستی هێدەکە بە راکێشان گەورە دەکەین :



8– سەیری بکە چۆن ئەو هێدەمان لەناو تێکستی هیدەرەکە دانا:



9- ئیستا دەچین دەستکاری ئەو ناوو نووسینە ئینگلیزیانە دەکەین , هەروەها دەتوانین رەنگی هێڵ و نووسین و نیشانەکان بگۆڕین :




@ بۆ گۆڕینی ناوەکان دەچین نووسینەکانی ناو تێکستەکان سەلێکت دەکەین و ئەگەر ویستمان بەکوردی بنووسین کلیکی Alt+Shift ی لای دەستە راست دەکەین و پاشان ئەوەی دەمانەوێت دەینووسین و لەلیستی فۆنتەکان فۆنتەکەی دەگۆڕین:



10- ئیستا لۆگۆ یان وێنەیەکیش بۆ هێدەکەمان دادەنێین, بۆئەم مەبەستە وەك لەوانەی پێشووتردا باسمان لێوەکرد , دەچین لە شریتی Objects دا کلیکی نیشانەی Picture Frameدەکەین ,لەو لیستەی دەرێتەوە Picture Frame File کلیك دەکەین:



11- کاتێك نیشانی زائیدەکەت بۆ دروست بوو بەماوسەکە یەك کلیك لەسەر پەرەکە بکە بۆکردنەوەی بۆکسی وێنە, بۆنموونە وێنەی سیدیەکە دیاری دەکەین و کلیکی Insert دەکەین:



12- ئەوە وێنەکەمان هێناو لەناو ئەم بۆشاییە دایدەنێین:



@ پاش تەواوبوون لە دیزاینی هێدی پەڕەی گۆڤارەکەمان دەچین

بۆدروستکردنی فووتەری گۆڤارەکەمان , بۆئەمەش دەچینە کۆتایی پەڕەکە:



1– سەرەتا ئەوەی دەمانەوێت لەناوتێکستەکەدا دەینووسین, ۆنموونە
دەنووسین: وێب – ژمارە (30) – نیسانی 2006 – ساڵی چوارەم



2– دوای تەواوبوون لەنووسینەکان , پێویستە بازنە یان چوارگۆشە یان هەر بەسادەیی شوین بۆ نووسینی ژمارەی لاپەڕەکان بنووسین , بۆئەمەش بۆنموونە ئەم بازنەیە دادەنێین و کلیکی لای ڕاست لەسەر بازنەکە دەکەین و لەوێشدا کلیکی Add Text دەکەین و پاشان ژمارەی پەڕەکە دەنووسین:



**دواى تەواوبوون لە دانانى هيدەرو فووتەر** كاتى ئەوە دێت بريار لەسەر ئەوەبدەين ئايا ئەو پەرِەيە لەچەند تێكست پێك بێت , با بلێين دوو تێكستە , دەچين لەشريتى Objects لەلاى دەستە چەپ كليكى ئايكۆنى تێكست دەكەين , ئينجا لەسەر پەرِەكە كليك دەكەين بۆ دانانى تێكستەكە:



## تێبينى :

ئەوەى لێرەدا گرنگە لەدانانى تێكستەكاندا ئەوەيە , كە بتوانيت هەردوو تێكستەكە بە يەك قەبارەو درێژى دابنێيت و بۆشاييەك لەنێوانياندا بهێڵەرەوە , بۆزانياريشت ئەو تێكستانە هێڵى وەهمين و لە پرينتدا وەكو هێڵ دەرناچن ,بەڵكو دەتوانيت خۆت هێڵى جياكەرەوەيان بۆ دروست بكەيت.

## چۆن تێکست بۆ پەڕەکەت دادەنێیت ؟

## چۆن ناونیشان بۆ پەڕەکەت دادەنێیت؟

## چۆن نووسین و وێنەکانت لەناو پەڕەکەدا دادەنێیت؟

## چۆن پەڕەکان دەکەیت بە PDF یان JPEG ؟

## چۆن پرێنتی دەکەیت؟

بۆ وەلاّمدانەوەی ئەم پرسیارانە پێویستە زۆر وردبین تاوەکو دیزاینی پەڕەکەمان ڕێك و جوان بێت و تەنسیقی تێدابێت.

سەرەتای کار تێکستێك دێنین لەنیوەی پەڕەکەدا دایدەنێین و پاشتر کۆپی دەکەین بۆلاکەی تر ..... یەکەم جار لەنیوەی پەڕەکەدا لای دەستە ڕاست تێکستەکە دادەنێین و ئینجا لەلای دەستەچەپیش هەمان تێکست کۆپی دەکەین و دایدەنێین , بۆکۆپیکردنی تێکستەکە لەسەر کیبۆردەکەمان پەنجە دەنێین بە دووگمەی ctrl و دەست بەرمەدەو بەماوسەکە تێکستەکەی لای دەستە ڕاست




دراگ بکە بۆلای چەپ, دراگ واتە ڕاکێشانی شتێك بەماوس.

* ئەوەی زۆر گرنگە لەسەرەتادا رەچاوی بکەیت ئەم خالآنەن:

1– لەسەرەوە واتە خوار هێدەرەکە شوێنێك بەجێبهێڵە بۆ نووسینی ناونیشانی بابەتەکە.

2– تێکستەکان بە پێوانە دابنێ ,بۆئەم کارەش سوود لەو راستەیەی سەرەوەی پەڕەکە وەربگرە.

3– وریابە ئەو ژمارانەی تۆ لەگەڵ نووسینەکاندا لەناو بەرنامەی WORD ەوە,کە دەیهێنیت بۆ Publisher پاشتر بیانکە بە فۆنتەکانی Arial .

4– دەتوانیت ناونیشانەکەی لەناو بەرنامەی Adobe Photoshop 9 me دا بنووسیت, یان ئەگەر ناتەوێت لەناو فۆتۆشۆپدا ناونیشانەکەی بۆ دیزاین بکەیت ئەوا هەرلەناو پەبلیشەردا ئەو کارە دەکرێت و وا باسی دەکەین.



**دانانی ناونیشان:**

بۆئەوەی ناونیشانێکی ماقوڵ بۆ بابەتەکەمان دابنێین , پێویستە ئەم هەنگاوانە بگرینە بەر:

1– دەچینەسەر Insert و Design gallery Object کلیك دەکەین , یان لەجیاتی ئەوە لەشریتی objectی لای دەستە چەپ کلیکی ئەم نیشانەیەی Design gallery Object دەکەین.

2– ئەم بۆکسەمان بۆدێت و کلیکی لیستی دووەم دەکەین واتە Objects by Designو لەوێدا لەبەشی Blocks ئەمەیان هەڵدەبژێرین و کلیک Insert objectsدەکەین یان دەبڵ کلیک لەسەر قاڵبەکە دەکەین بۆئەوەی بێتە ناو پەڕەکەمانەوە.



3– ئەوە قاڵبەکە هاتە ناو پەڕەکەمانەوەو ئیستا دەیبەینە سەرەوەو بچووکی دەکەینەوە:



4- دوای ئەوەی قاڵبەكەمان بچووك كردەوەو بەقەد قەبارەی شوێنەكەی دامانا ئینجاكاتی ئەوەیە ناونیشانی بابەتەكەت لەناویدا بنووسیت :

بۆنموونە ئەمە ناونیشانی بابەتەكەمانە:

زانیاری لەسەر ڤایرۆسی كۆمپیوتەر



5- بۆ ئەوەی جوانتر ناونیشانەكە ببینیت , پێویستە كلیكی نیشانەی بینین واتە print preview بكەیت, كە ئەمە نیشانەكەیەتی

یاخود بچۆرە سەر print preview < File.



6– بەمجۆرە ناونیشانەکەمان دەبینین:




بۆگەڕانەوە بۆ باری پێشوو لێرەدا کلیکی close بکە .

7– ئیستا بۆ تەواوکردنی دیزاینی پەڕەکەمان پێویستە بچین لەسەر کیبۆردەکەدا دەست بنێین بە دووگمەکانی CTRL+M و دێینەوە ئێرە:



8- بەرلە دیزاینی بابەتەکە پێویستە ناوی نووسەر یان ئامادەکار یان وەرگێڕەکەی بنووسین,بۆ ئەم کارەش پێویستە تێکستێك دابنێین و ناوی کەسەکەی تیا بنووسین:



9- دەتوانین هێڵێکی باریك بەدەوری تێکستەکە دانێین تاوەکو لەگەڵ ناونیشانەکە تێکەڵ نەبێت, بۆئەمە دەچین یەکەمجار تێکستەکە سەلێکت دەکەین و پاشان لێرە هێڵێکی بۆ دێنین:



10– بەمجۆرە چوارچێوەمان بۆ دانا:




11– ئەگەر ویستمان دەتوانین باکگراوند بۆ تێکستی ناوەکە دانێین , لێرەدا پێویست بچینەسەر تێکستەکەو سەلێکتی بکەین و ئینجا کلیکی لای راستی لەسەر بکەین و Format Text Box کلیك بکەین , یان بچینەسەر لیستی Format و لەوێشدا Text Box کلیك بکەین:



11– لەئەنجامدا ئەم بۆکسەمان بۆدێت و ئەم ئامادەکاریانەی تێدا دەکرێت:




دوای هەڵبژاردنی ئەوەی دەمانەوێت کلیکی OK دەکەین.

ئەمەش ئەنجامەکەمانە:



12– ئیستا دەست دەکەین بە دانانی نووسینەکەمان لەناو تێکستەکاندا ,
باوایدانێن ئێمە لەناو بەرنامەی word بابەتەکەمان تایپ کردووە , دەچین
لەناو ئەوشوێنەی بابەتەکەمان تایپ کردووە بابەتەکە سەلێکت و پاشان کۆپی
دەکەین و لەناو تێکستی دەستە راست پەیستی دەکەین:

ئەمە بابەتەکەمانە لەناو word :




تێبینی :

1– وەکو پێتشر باسمان کرد تکایە وریای ژمارەکان بن ,چونکە ئەو ژمارەیەی
تۆ لە بەرنامەی word دەینووسیت , ئەوا لەبەرنامەی Publisher دا وەکو
چوارگۆشە دەردەکەوێت , بۆیە زۆر پێویستە یەکسەر ئەو ژمارانە کۆپی
بکەیت و بیانکەیت بە فۆنتەکانی Arial ی ئینگلیزی.

2– واباشە بۆ گۆڤار سایزی نووسینەکانت 12بن.

13– ئەوە نووسینەکانە لەناو تێکستەکەدا پەیستمان کردووە :




14– بۆئەوەی ئەو نووسینەی ماوەتەوە بیخەینە ناو تێکستی دووەم , ئەوا کلیکی ئەم ڕەمزە بکە  و پاشان ,کە نیشانەی سەتڵێکت بۆ دروست بوو , بچۆ لەناو تێکستی دووەم کلیك بکە ., خۆی ئۆتۆماتیکی نووسینەکانی ترت بۆ ئیزافە دەکات.

سەرنج بدە:



15– ئیستا بەر لەهەر شتێك بچۆ چی ژمارە هەیە سەلێکتی بکەو بیانە بەفۆنتەکانی Arial .

**تێبینی :** بۆئەوەی زووتر دانە دانە ژمارەکانت بکەیت بە فۆنتەکانی ئاریەڵ پێویستە ,یەکەم ژمارەت چاك کرد ئینجا بەهۆی سەلێکت کردنی ژمارەکەو پاشان هەڵبژاردنی ئەم فەرمانە واتە فەرمانی Format Painter . لە لیستی ئامرازەکان ئەوانی تر بکەیت بە فۆنتی ئاریەڵ.




ئەوە ژمارەکانمان چاك کرد:



16– ئيستا نووسينەكان جەستى فاى دەكەين Justified دەكەين , بۆئەوەى دێرەكانى رێك بێت , بۆ ئەم كارەش نووسينەكەمان سەلێكت دەكەين و دەچينەسەر Format و پاشان Paragraph كليك دەكەين:



17– ئەم بۆکسەمان بۆدێت و لەم لیستەدا Justified هەڵدەبژێرین و کلیکی OK دەکەین.



ئەوەی ماوە تەنها ئەوەیە وێنەیەك یان چەند وێنەیەك دابنێین بۆ ناوتێکستەکەمان.

بۆئەم کارەش دەچینەسەر ئامرازی Object لای دەستە راست و کلیکی Picture From file دەکەین یان دەچینەسەر Insert و ئینجا Picture کلیك دەکەین و پاشان from file کلیك دەکەین.



18–ئینجا کلیکی ناو تێکستەکە دەکەین بۆ دەرکەوتنی بۆکسی وێنەکان, ئەم بۆکسە دێتە بەردەممان و ئەو وێنەیەی دەمانەوێت سەلێکتی دەکەین و کلیکی Insert دەکەین, یاخود لەجیاتی ئەوە دەبڵ کلیکی وێنەکە بکە خۆی دادەبەزێت.



19– سەرنج بدە وێنەکە هاتووە :



**تێبینی** : لە هەر چوار سووچی وێنەکەوە دەتوانیت وێنەکە گەورە بکەیت و لەناوەڕاستی پەڕەکەدا دایبنێیت.

20– ئەوە وێنەكەمان گەورە كردو لەناوەڕاستى پەڕەكەدا دامانناوە, واتە لە ناو هەردوو تێكستەكە , تێبينى ئەوە دەكەين ,كە ئۆتۆماتيكى بەرنامەكە جێگەى بۆ وێنەكە كردۆتەوەو نووسينەكانى بەدەورى وێنەكەدا دابەشكردووە.




@ بۆئەوەى وردتر تەواوى پەڕەكەمان ببينين كليكى Print Preview دەكەين:



## چەند تێبینییەکی گرنگ سەبارەت بەدیزاینی پەڕەکانی گۆڤار:

1- ئەگەر هاتوو ئەو بابەتەی دیزاینی دەکەیت بۆ گۆڤارەکەت لە 1 لاپەڕە زیاتر بوو , ئەوا دەتوانیت دوو ڕێگا بەکاربهێنیت , یەکەمیان پەڕە بەپەڕە دیزاینی بکەیت واتە بۆنموونە بابەتەکەت 3 لاپەڕەیە , ئەوا دەبێت بە 3 پەڕەی جیاواز دیزاینی بکەیت , ڕێگای دووەمیش ئەوەیە, کە پێش دەست بەکاربوون لە دیزاین بچیت لەرێگەی Insert>Page ئەو کارە بکەیت , یان لەسەر کیبۆردەکەت دەست بنێ بە ctrl+shift+N , ئینجا ئەم لیستەت بۆدێت و لەوێدا کلیکی Page بکە:




یەکسەر ئەم بۆکسەت بۆدێت و لەناو ئێرە ,کەنووسراوە Number of new page ژمارەی لاپەڕەی بابەتەکەت بنووسە بۆنموونە 3دەنووسین و هەڵبژاردنی یەکەم, کەنووسراوە Before current pageکلیکی ok دەکەین.




ئەمە بۆئەوەی تێکست دابنێیت بۆ پەڕەکەت...

سەرنج بدە لاپەڕەکانت بۆدروست بوو, بۆیە 4 پەڕەت پێی نیشان دەدات

چونکە پێشتر خۆی پەڕەیەکی ئامادەکراوی کردۆتەوە بۆت.

ئیستا پێویستە ئەو پەڕانە سەیڤ بکەیت بۆئەمەش دەچیتەسەر File> Save



یان لەشریتی ئامرازەکان کلیکی ئایکۆنی save بکەو ئەم بۆکسەت بۆدێت.

لێرە ناوێکی لێبنی بۆنموونە kico mag6



2– دەتوانیت پەڕەکانت بۆ چەند فۆرماتێك بگۆڕیت , بۆنموونە دەمانەوێت بیکەین بە فایلی وێنەیی JPEG .

سەرەتا دەچین پەڕەکەمان دەکەینەوەو لە لیستی File کلیکی Save as دەکەین:



ئەم بۆکسەمان بۆدێت و لە خانەی Save as type فۆرماتی JPEG file هەڵبژێرە و لە لیستی File name ناوی لێبنی و کلیکی Save بکە.



ئەوەتا پەڕەکەمان کرد بە فۆرماتی JPEG .




## کردنی پەڕەکان بە فۆرماتی PDF :

بۆئەم کارە پێویستە سەرەتا یەکێك لەبەرنامەکانی PDF WRITER دابەزێنین ,کە پەڕەکانمان بۆدەکات بە فۆرماتی pdf و پاشان بەرنامەی Adobe Reader دابەزێنین بۆ خوێندنەوەی ئەو پەڕانەی کردوومانە بە پی دی ئێف.

## تێبینی:

لەناو سیدی کتێبی مایکرۆفت پەبلیشەر هەردوو بەرنامەکە وەربگرە, واتە بەرنامەی Adobe Reader و Cute pdf .

**دوای دابەزاندنی ئەو دوو بەرنامەیە بۆ کردنی پەڕەکانمان بە پی دی ئێف ئەم ڕێگایانە بگرە بەر:**

1- پەڕەکەت بکەرەوە:



2- ئینجا لە لیستی File دا print هەڵبژێرە:



3- ئينجا ئەم بۆكسەى print ديێت تۆ لەم ليستەى بەردەمت كليكى هەڵبژاردنى Cute PDF Writer بكە.لەخوارەوەش ئۆكەى بكە.




4- كەمێك چاوەڕوان بە تا بۆكسى سەيڤكردن ديێتە بەردەمت, ئينجا لەليستى File name دا ناوێكى لێبنى بۆنموونە sar 12, لەليستى save in شوێن بۆ سەيڤكردنى دەستنيشان بكە:



5- پاش کەمێك چاوەڕوانی پەڕەکەمان دەبێتە فۆرماتی PDF , ئیستا دەچین لە ناو درایڤی :F دا سەیری دەکەین:



6- بەدەبڵ کلیك کردن لەسەری ئەم رووکارەمان بۆدێت:



# دیزاینی کتێب بەبەرنامەی پەبلیشەر

دیزاینی کتێب بەبەرنامەی پەبلیشەر کارێکی ئاسانە, بەڵام شارەزایی و سەلیقەی دەوێت ,لێرەدا نموونەی دیزاینی کتێبێك بۆ ئێوە باس دەکەم:

1– بەرنامەی پەبلیشەر بکەرەوە و کلیکی پەڕەیەکی نوێ بکە لەلیستی شریتی ئامرازەکاندا, کە ئەم رەمزەی هەیە:




یان دەتوانیت بچیتەسەرFile>New




2– ئەمەت بۆدەکرێتەوەو تۆ بچۆ قەبارەی پەڕەی کتێبەکەت دیاری بکە , بۆئەم مەبەستە بچۆ کلیکی File و پاشان Page Setup بکە.



3- ئەم بۆکسەت بۆدێت , سەرنج دەدەین پێوانەی پەڕەکەمان بە ئینچەو دەبێت لەلیستی Tools دا بیگۆڕین بۆ سانتیمەتر . جارێ ئەم بۆکسە دابخە.




**چۆن پێوانەی پەڕەکەمان بکەین بە سانتیمەتر؟**

A / دەچینەسەرلیستی Tools و پاشان لەوێدا کلیکی Options دەکەین:



B / ئەم بۆكسەت بۆدێت و لەلیستی Genaral دا Centimeters دیاری بكەو لەخوارەوە ok كلیك بكە.




4– ئیستا دەچینەوەبۆسەر File> Page setup و ئەم بۆكسەمان بۆدێت, سەرنج دەدەین, كە پێوانەی پەڕەكەمان بووە بەسانتیمەتر:



5– باوايدانێين پێوانەى كتێبەكەمان نيو ئەى فۆرە A4 بۆيە پێويستە سەرەتا كليكى Custom بكەين و بۆ پانى 14.8 سم و بۆ درێژى 21 سم ديارى بكەين و كليكى ok بكەين:




6– پاشان بەمجۆرە پێوانەى پەرەكە دەبينين پەرەكە دادەنێين :



8- ئینجا ئیستا کتێبەکەمان چەند لاپەڕەی نیو ئەی فۆر دەردەچێت دیاری دەکەین و پاشان تێکست و ژمارەیان بۆدادەنێین:

بۆئەمەش دەچینەسەر Insert و پاشان کلیکی Page دەکەین:




9- پاشان ئەم بۆکسەمان بۆدێت ئەم کارە گرنگانە جێبەجێ بکە:




لێرە ژمارەی لاپەڕەی کتێبەکەت بنووسە بۆ نمونە کتێبەکەمان 120 لاپەڕەیە...

لێرە تێکست بۆ Text پەڕەکەت دیاری بکە. تکایە نیشانەکە لەناو ئەم بازنەیە دابنێ...

دواجار کلیکی ok بکە.

10– ئیستا بچۆ ژمارە بۆ پەرەکەت دابنێ , بۆئەم مەبەستە بچۆرەسەر Insert و پاشان Page Number:




11– ژمارەکە با لەخوارەوەی پەرەکەدا بێت و ژمارەکەش لەناوەڕاستی پەرەکەدا دابنێ بەمجۆرە:




لێرە Bottom of Page دیاری بکە.

لێرە Center دیاری بکە.

ئینجا کلیکی ok بکە.

12- ئیستا بەوجۆرە کتێبەکەمان دابەش کردووە , کە پەڕەی یەکەم ژمارەمان پێی نەداوە , چونکە ناونیشانی کتێبەکەی تیادەنووسین.



13- لێرەوە دەچیتەسەر پەڕەکانی کتێبەکەت:



14- با ئەو کتێبەی هەمانەو تایپمان کردووە لە word یان لە پەبلیشەر کۆپی بکەینە ناو کتێبەکە بۆ ئەم مەبەستە دەچینەسەر پەڕەی ژمارە 2و ئەوەی کۆپیمان کردووە paste دەکەین:



دەبینین ئەو نووسینانەی لەناو پەڕەی ژمارە 2 دا paste مان کردووە خۆی دەچێتە ناو پەڕەکانی تر , ئیستا دەچین Justify نووسین و پەرەگرافەکان دەکەین,بۆئەم مەبەستە سەلێکتی تەواوی نووسینەکەمان دەکەین و لە شریتی ئامرازەکانی ڕێکخستن کلیکی یەکەمین ئایکۆن واتە ئایکۆنی Justify دەکەین.



15– پاشان دەست دەكەین بەدانانی ناونیشانەكان و ئیبرازكردنیان, بۆنموونە لە ناونیشانی كتێبەكەوە دەست پێدەكەین بۆنموونە كتێبەكەمان لەسەر ئەنتی ڤایرۆسە , لەپەڕەی یەكەمدا دەنووسین ئەنتی ڤایرۆس و ناوی نووسەر و دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەكەشی دەنووسین لەگەڵ ساڵ و شوێنی دەرچوونی:



**تێبینی :** دەتوانین سوود لەو قاڵبە ئامادەكراوانە وەربگرین و كلیكی یەكێكیان بكەین , سەرنج بدە چۆن بۆ پەڕەی یەكەم سوودمان لە قاڵبە ئامادەكراوانە وەرگرت:



16- ئیستا دەچین لەلا پەرِەی 2دا ئەمانە دەنووسین:

ناوی کتێب: ئەنتی ڤایرۆس

ناوی نووسەر : سەرکەوت پێنجوێنی

ساڵ و شوێنی چاپ: سلێمانی – 2006

زنجیرە کتێبی : رێکخراوی kico

تیراژ: 1000دانە

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

ژمارەی سپاردن لەوەزارەتی رۆشنبیری(   )



17- لەلاپەڕە 3دا ئەو بەشانەی لەناو کتێبەکەدایە دەنووسین, بەمجۆرە:



18- ئینجا پێشەکییەك لەلاپەڕە 4 دا بنووسە:



16– ئیستا دەست دەکەین بە دانانی بەشەکان و گەورەکردنی ناونیشانەکان و دانانی وێنەو نیشانەی سەهم بۆ بابەتەکان:

بۆ ئەم کارەش دەچینەسەر پەڕەی 5 و لێرەوە کلیکی دەکەین:



17– لێرەدا بەئینتەر نووسینەکان دێنینە خوارەوە پاشان دەنووسین

**بەشی یەکەم – ڤایرۆس چییە؟**



@@@@@@@@@@@@

18– ئینجا ئەو ناونیشانەی بەشەکان سەلێکت دەکەین و پاشان گەورەیان دەکەین و فۆنتی جوانیان بۆ هەڵدەبژێرین:




بۆ گەورەکردنی نووسینەکان دەچین ئەو بەشەی دەمانەوێت گەورەیان بکەین سەلێکتیان دەکەین پاشان لەسەر کیبۆردەکە دەست دەنێین بە CTRL + پیتی (د)ی عەرەبی.

یان کلیکی ئێرە دەکەین و سایزێك دیاری دەکەین, لێرە فۆنت دیاری دەکەین.



19– ئینجا دەچین وێنە بۆناو بابەتەکە دادەنێین , بۆئەم مەبەستە , بۆنموونە وینەیەکی دیسك تۆپ دەگرین دەچین لەسەر کیبۆردەکە دەست دەنێین بەدووگمەی print screen دا و لەناو ئەو لاپەڕەیەی دەمانەوێت وێنە پرێنت سکرین کراوەکەی تیادابنێین کلیکی لای ڕاست دەکەین و Paste هەڵدەبژێرین:




بەمجۆرە وێنەکەمان بۆ دادەنێت ئینجا ئێمە دەستکاری دەکەین و زیادەکانی دەبڕین:



20- لەهەر چوار سووچی وێنە پرێنت سکرین کراوەکەوە دەتوانین وێنەکە بچووك و گەورە بکەین:

ئەوەتا بچووکمان کردوو لێرەدا دامانناو خۆی جێگەی بۆ نووسینەکان کردەوە:



تێبینی : لەرێگەی شریتی pictute ەوە دەتوانین بەچەند جۆرێك ئەو وێنانە دابنێین :




1- بۆ سڕینەوەی وێنەکە. 2- ڕەنگ دانان لەسەر وێنەکە.
3- لیستی format picture لەزۆر شوێندا باسمان کردووە.
4- هەڵبژاردنەکانی دانانی وێنە . 5- دانانی هێڵی هەمەجۆر.
6- بۆ بڕینی لایە زیادەکانی وێنە. 7- ئیزافەکردنی وێنە بۆ سکانەرو کامێرا.
8- هێنانی وێنە بۆ ناو پەڕەکە.

**تێبینی:** ئەگەر هاتوو لەحاڵەتێکدا تایپی کتێبەکەت تەواوکردوو ویستت لەناو پەڕەکانتدا دابنێیت و نووسینەکەت تەنها چووە ناو یەك لاپەڕە ئەوا پێویستە ئەم ڕێگایە بگریتەبەر:

1- پاش ئەوەی حەجمی پەڕەکەت دیاریکردوو ژمارەی پەڕەت دیاریکردو دواتر ژمارەت بۆدانا , ئیستا بچۆ ئەو کتێبەی نووسیوتە لە وێرد یان لەناو پەبلیشەر سەلێکت و ئینجا کۆپی بکە و لەناو پەڕەی 3یان 4,کە بۆ کتێبەکەت داناوە paste بکە.

وەرە دێری کۆتایی پەڕەکە سەلێکت بکەو بچۆلە شریتی ئامرازەکان کلیکی نیشانەی



Creat text box link بکە, کە ئەمە نیشانەکەیەتی وماوسەکەت دەبێتە ئەو نیشانەیە:



2– پاشان بچۆرە پەڕەی دوای ئەوو ئینجا کلیك لەناو پەڕەکەدا بکە و ئەم نووسینانەت بۆ دادەنێت , بەردەوام بە لەسەر ئەوکردارە تا کۆتایی پەرەکە.




## چۆن هیدەرو فۆتەر بۆ کتێبەکەت دادەنێیت

**بەبێ ئەوەی بچیتەسەر** view>headerand footer ؟

1– بەرلەدانانی نووسینە تایپکراوەکانت بچۆ بۆ پەڕەی دووەمی کتێبەکەت و لەسەرەوەو خوارەوەدا لەلاپەڕەی دووەمدا دووتێکست بە بەم قەبارەیە دابنێ :



2– ئەوەی دەتەوێت لەناو هیدەرو فووتەرەکەی سەرەوەو خوارەوەدا بنووسە,

بۆنموونە ئێمە بەمجۆرە دەینووسین:




فووتەری خوارەوەش بەمجۆرە دەنووسین:




تێبینی : دەتوانین وێنە – لۆگۆ – هێڵ – زۆرشتی تر لەناو هیدەرو فووتەر دابنێین , بەلاَم واچاکترە قەرەباڵغ نەبێت.

# دروستكردنی كارت بەبەرنامەی پەبلیشەر

بەرنامەی پەبلیشەر بەرنامەیەكی نایابە بۆ دروستكردنی كارتی كەسی و كارتی بازرگانی بۆ نووسینگەو كۆمپانیا بازرگانییەكان و شوێنە رووناكبیری و هونەرییەكان.

لەم بەشەدا باس لە دروستكردنی كارتێكی كەسی و كارتێكی تایبەت بە كاروباری بازرگانی و یەكێكی تایبەت بە رێكخراوێك دیزاین دەكەین.

## دروستكردنی كارتێكی كەسی بەبەرنامەی پەبلیشەر:

1– سەرەتا بچۆ بەرنامەی پەبلیشەر بكەرەوە ئەم رووكارەت بۆدێت:

لەلای دەستە راست كلیكی Publications for print بكە:



2– ئینجا لەم لیستەدا وەرە خوارەوە تادەگەیتە هەڵبژاردنی

Businees Cards وئینجا یەکسەر ئەم نموونانەت بۆدێت و یەکێکیان دیاری بکەو دەبڵ کلیکی لەسەر بکە:



3– بۆنموونە ئەم قاڵبە ئامادەکراوە هەڵدەبژێرین و دواتر دەستکاری دەکەین:



4- پاش کلیك كردن لـەسەر ئەو قاڵبە , ئەممەمان دێتە پێش و دەتوانین بەئارەزووی خۆمان دەستکاری بکەین:




5- سەرەتا ناوی خۆمان لـێرە دەنووسین ,ئەگەر بەكوردی بینووسین لای راست دەینووسین , ئەگەر بەئینگلیزی بوو لای چەپ ناوەكەمان دەنووسین:



6- مەرج نییە رێك بەوجۆرەی من دامناوە تۆش ئاوها كارتەكەت دیزاین بكەیت , دەتوانیت وێنەو كلێشەی تری بۆ بهێنیت.

ئیستا بۆ ئەوەی جوان ئەنجامی ئیشەكەمان ببینین كلیكی print preview دەكەین:




**تێبینی :**

1- لەهەر چوار لای كارتەكەوە 1سم بەجێبهێڵە تاوەكو لەكاتی راكێشان و بڕیندا نووسین بەرنەكەوێت و بېڕدرێت.

2- دەتوانیت رەنگی ئەم باكگراوندانە بگۆڕیت , بۆئەم مەبەستە بچۆرەسەر Format>Coler schemes, یان لەلای لیستی تاسك بین بچۆرە سەر Coler schemes.






* پاشان ئەم شێوە ڕەنگانەت بۆدێت ,کلیکی هەریەکێکیان بکەیت شێوە ڕەنگی کارتەکەت دەگۆڕێت.



**دروستكردنى كارتێكى تايبەت بۆ كۆمپانيايەک بەبەرنامەى پەبليشەر:**

لەم نموونەيەدا باس لەدروستكردنى كارتێكى تايبەت بە كۆمپانيايەك دەكەين ,

1– سەرەتا بچۆ بەرنامەى پەبليشەر بكەرەوە ئەم رووكارەت بۆدێت:

لەلاى دەستە راست كليكى Publications for print بكە:




2– ئينجا لەم ليستەدا وەرە خوارەوە تادەگەيتە هەڵبژاردنى Businees Cards وئينجا يەكسەر ئەم نموونانەت بۆدێت و يەكێكيان ديارى بكەو دەبڵ كليكى لەسەر بكە:



3- ئیستا ئەم قالّبەمان لـەبەردەستدایەو دەتوانین بەئاسانی دەستکاری بکەین و ئەوەی دەمانەوێت بینووسین:



@ دەتوانین لـێرەوە ئاراستەی نووسین و قالّبەکان بگۆڕین:

4- دەست دەکەین بە نووسینی ناو قالّبەکە, سەرەتا لـەسەرەوە ناوی کۆمپانیاکە دەنووسین بۆنموونە ناوی کۆمپانیاکە بەناوی( **سیڤان** )ە.

ئینجا ناوی خاوەن و ناونیشانەکەی و پاشان سایت و ئیمەیلّ ئەگەر هەبیوو, دواتر تەلـەفۆن و مۆبایل.



5– بۆ بینینی کارەکەت کلیك print preview بکە:




**دروستکردنی کارتێکی تایبەت بە ڕێکخراوو ناوەندو کۆمەڵە ڕووناکبیرییەکان:**

1– سەرەتا بەرنامەی پەبلیشەر بکەرەوە:



2– ئینجا بچۆ کلیکی Publications for printبکەو دواتر بچۆرە سەر : Business Cards



3– بۆنموونە ئەم شێوەیە دەستنیشان دەکەین:



4– ئەمەش قاڵبەکەیە , بۆنموونە کارتێکی تایبەت بە ڕێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەری کوردستان دروست دەکەین:




5– لێرە ناوی ڕێکخراوەکە دەنووسین , پاشان لەلای دەستەچەپ ناونیشانی شوێن و سایت و ئیمەیڵ و تەلەفۆن و مۆبایل دەنووسین:



6- چەند شتێکی گرنگ هەیە دەبێت لەکاتی دروستکردنی کارتدا بیزانیت:

لەوانە:

A/ مەرج نییە ئەو تێکستانەی داتاوە هەمان تێکستی ئامادەکراو بن, دەتوانیت تێکستەکان بگۆڕیت و ئەوەی زیادەیە لایبەریت.

B / پێویستە لەسەرەتای دەستکردن بە دروستکردنی کارتەکە بچیت فایلەکە save بکەیت.

C / ئەو تێکستانەی ناتوانیت لەرێگەی Coler schemes ڕەنگەکانی بگۆڕیت, دەبێت بچیتە سەر تێکستەکەو کلیکی لای ڕاست بکەیت و لەوێشدا کیلکی Format Text Box بکە:



لەو بۆكسەی بۆت دێت بچۆرەسەر color و رەنگێك دیاری بكەو كلیكی Ok بكە لەخوارەوە.




**تێبینی** : دەتوانیت لۆگۆی تایبەت بەخۆت بهێنیت و لەناو قاڵبی كارتەكە دابنێیت.

## دروستكردنی بانەر بۆ كاری جۆراوجۆرو كیتابی رەسمی

بۆئەم كارە زۆرجار پێویستە سیدی ئۆفیسی 2003,كە لەگەڵ ئەم كتێبەدایە لەناو سیدی روومەكە دابنێین , چونكە خۆی داوای ئەوە دەكات سیدی ئۆفیس لەناو سیدی روومەكەت دابنێیت.

بۆ دروستكردنی كیتابی رەسمی فەرمانگەو ناوەندو رێكخراوەكان بەشێوەیەكی شیاوو جوان پێویستمان بە جێبەجێكردنی ئەم هەنگاوانە هەیە:

1– بەرنامەی پەبلیشەر دەكەینەوە, ئینجا كلیكی ئێرە دەكەین , كە نووسراوە Publications for print



2– ئینجا لەوێدا دەچینە خوارەوەو كلیكی Banner دەكەین و چەند شێوەیەكی ئامادەكراو دێتە بەرچاومان:

یەكێك لەم نموومانە كلیك بكە:



3– ئەوەتا ئیستا داوای ئەوەمان لێدەكات سیدی ئۆفیسی 2003داغڵ بكەین ,
ئێمەش دەچین سیدییەكە داغڵ دەكەین, لێرەدا yes كلیك بكە.



4- ئەمەش نموونەکەمانە ودەستکاری دەکەین , بۆنموونە ئیستا کیتابێکی رەسمی بۆ رێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەری کوردستان دروست دەکەین, لەناو بانەرەکە کلیك دەکەین و لەناوەڕاستدا ناوی رێکخراو یان شوێنەکەمان دەنووسین,کلیکی تێکستە ئینگلیزییەکە بکەو پاشان لەسەری پەنجە بنێ بە دووگمەکانی Alt+Shift و ئینجا بەکوردی بنووسە:

## رێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەری کوردستان

بەئینگلیزیش دەینووسین:




**تێبینی :** بانەرە ئامادەکراوەکە گەورەیە بۆیە دەتوانیت بەفۆنتی سایزی 72 بۆسەروتریش نووسینی پێی بنووسیت.

5- دەتوانین لەرێگەی شریتی Banner Options ەوە دەستکاری درێژی و پانی و گرافیك و چوارچێوەی بانەرەکە بکەین:




6- کلیکی ئەم سەهمە بکە بۆ دەرکەوتنی custom width, کە لێیەوە چەند ئامادەکارییەك دەکەیت:

7- ئەم بۆکسەت بۆدێت, کە بریتییە لە بۆکسی page setup واتە رێکخستنی باری درێژی و پانی پەڕەکەت .




8- دەتوانین چوارچێوەی بانەرەکە بگۆڕین, بۆئەم مەبەستە دەبڵ کلیك لەسەر بۆردەرەکە دەکەین:




9- ئەم بۆکسە دێت و لێرەوە ئەم ئامادەکاریانە بکە:



10– دەتوانین رۆژو ژمارەی كیتابەكە و نووسینی تر دابنێین ,هەروەها هەر وێنەیەك بكەینە باكگراوند , یان لەجێگەی لۆگۆ دانراوەكە لۆگۆی خۆمان دابنێین.

## دروستکردنی رۆژژمێر بەئاسانی و بەدڵی خۆت

زۆر کەس وادەزانن هەر دەبێت بەبەرنامەی ئەدۆب فۆتۆشۆپ رۆژژمێر دروست بکەین , بەڵام دروستکردنی رۆژژمێر لەناو بەرنامەی پەبلیشەر زۆر ئاسانە , چونکە بەرنامەکە بەحازری رۆژژمێری ساڵەکانی بۆداناویت ,ئەوەی لەسەر تۆیە ئەوەیە , کە دەستکاری قاڵبە حازرەکە بکەیت و چاپی بکەیت, بەڵام تکایە لەبیرت نەچێت , کە بەرنامەی پەبلیشەرت کردەوەو نیازت هەبوو رۆژژمێر بۆخۆت دروست بکەیت , ئەوا سیدی ئۆفیسی 2003 دابنێ چونکە دڵنیابە بەرنامەی پەبلیشەر داوات لێدەکات .

## هەنگاوەکانی دروستکردنی رۆژژمێرێکی جوان بۆخۆت:

1– بەرنامەی پەبلیشەر بکەرەوەو سیدی ئۆفیسی 2003 بخەرە ناو سیدی رۆومەکەت, ئەم رووکارەت بۆدێت و بچۆرەسەر Publications for print



2- لەخوارەوە کلیکی Calendars بکە واتە رۆژژمێر, ئەم نموونانە دێتە بەردەمت یەکێکیان هەڵبژێرە بۆ نموونە ئەمەیان هەڵدەبژێرین:




3- زۆر بەوردی سەرنج بدە:




ئەمە قاڵبی رۆژژمێری مانگی ئازاری 2006ەو ئەگەر بتەوێت هی رۆژژمێری ساڵێك بێتە بەرچاوت لێرە کلیك بکە و Yearly

4- باسەرەتا بچین رۆژمێرەکە بکەین بەهی ساڵێك واتە ساڵی 2006 , چونکە ئەوەی پێشتر هی تەنها مانگێك بوو.بۆئەم مەبەستەش کلیکی yearly دەکەین لەلای دەستەچەپ, سەرنج بدە بوو بەرۆژمێری ساڵێك:



5- ئیستا دەتوانین وێنەو نووسینەکان بگۆڕین , سەرەتا با لەنووسینەکانەوە دەست پێی بکەین,



دەچین لێرە دەنووسین رۆژمێری ساڵی 2006

6- ئینجا ناوی ئەو شوێنەی رۆژژمێرەکەی ئامادەکردووەو ناوی دیزاینەر دەنووسین, دەچین لێرە تێکستێك دادەنێین و ناوی شوێنەکە دەنووسین,کە رۆژژمێرەکەی ئامادەکردووە, لەخوارەوەش ناونیشانی شوێن و ئیمەیڵ و سایت و تەلەفۆن دەنووسین:




بۆهێنانی تێکست دەتوانیت لێرە تێکست کۆپی بکەیت و لەوولاتر دایبنێیتەوە, یان لەسەر کیبۆردەکەت دەست بنێ بە ctrl و پاشان تێکستەکە دراگ بکە بۆ ئەو شوێنەی دەتەوێت.

7- مادام رۆژمێرەكەمان تایبەتە بەگۆڤاری وێب واچاكە بەرگی ژمارەیەكی گۆڤارەكە دابنێین , یاخود وێنەیەكی كۆمپیوتەر یان یوزەرێك دابنێین, كە لەسەر كۆمپیوتەر كاردەكات, باسەرەتا وێنەی سەر رۆژمێرەكە دیلیت بكەین, ئینجا دواتر وێنەكەی خۆمان دابنێین.

بۆهێنانی وێنە دەچینە لای دەستە چەپ و لە شریتی Objects دا كلیكی Picture Frame دەكەین, كە ئەمە ئایكۆنەكەیەتی ← 




8- پاش ئەوەی كلیكی ئەو ئایكۆنەمان كرد, ئەم لیستە دەكرێتەوە لەویشدا كلیكی Picture from File دەكەین:



9– ماوسەکەمان دەبێتە نیشانەی زائیدو دەچین یەك کلیك لەناو ئەو تێکستە دەکەین , کەوێنەکەی بۆ دێنین:



10– ئەم بۆکسە دێت و لەوێدا وێنەکەت بدۆزەرەوەو بیهێنە ناو رۆژژمێرەکە:




@ بۆهێنانی وێنەکە کلیکی Insert بکە یان دەبڵ کلیك لەسەر وێنەکە بکە.

11– ئەوەتا وێنەكە هاتە ناو تێكستەكە ئیستا لەیەكێك لە چوارلاكەیەوە بە ماوسەكە رایكێشە تا گەورە دەبێت و پڕ بەپڕی تێكستەكە داینێ:



12– سەرنج بدە چۆن وێنەكەمان دانا:

نابێت ئەوەت لەبیر بچێت, كە ئەگەر هاتوو تێكستی ژێر وێنەكە گەورەتر بوو , ئەوا دەبێت تێكستەكە بچووك بكەیتەوە, یان بەپێچەوانەوە.



13– ئەگەر هاتوو لەحاڵەتێکدا ویستمان رەنگێك بۆ باکگراوندی هەر تێکستی یەکێك لەمانگەکان دابنێین , ئەوا پێویستە سەرەتا تێکستی ئەو مانگە سەلێکت بکەین و دەبڵ کلیکی لەسەر بکەین, ئەگەر ویستمان هەمووی سەلێکت بکەین و باکگراوندی هەموو مانگەکان بگۆڕین , لەو ئانەدا پێویستە ,کە مانگی یەکەمان سەلێکت کرد ئینجا لەسەر کیبۆردەکە دەست بنێین بەctrlو دەست لانابەین لەسەر ctrl و پاشان دانە بەدانە تێکستی مانگەکان سەلێکت بکەین و ئینجا کلیك لەسەر یەکێکیان بکەین و رەنگێك دیاری بکەین:



* پاشان ئەم بۆکسەمان بۆدێت:

+ لێرە رەنگ بۆ باکگراوندی تێکستەکان هەڵدەبژێرین.

+ لێرە چوارچێوە دیاری دەکەین.




**تێبینی : دەتوانین زۆر شتی تر بۆ ناو رۆژژمێرەکە ئیزافە بکەین , بەڵام بۆ ئەوەی قەرەباڵغ نەبێت هێندە بەسە.**

* دواجار بەمجۆرە ئەنجامی کارەکەمان دەبینین:



@ دەتوانین بەسوود وەرگرتن لەو قاڵبانەی لەوناو بەرنامەی پەبلیشەردا هەیە بۆمانگەکانیش بەتەنها رۆژژمێر دروست بکەین.

سەرنج:

1– لەکاتی کارکردن بۆ دروستکردنی رۆژژمێر زوو زوو هەنگاوەکانت save بکە.

2– بۆ بینینی کارەکەت بە تەواوەتی کلیکی print preview بکە:



# دروستكردنی كەتەلۆگ بۆ بەرهەم و كاڵاكان

لەناو پەبلیشەردا ئاسانكاری كراوە ,تاوەكو بتوانیت زۆر بەئاسانی كەتەلۆگ بۆ بەرهەم و كاڵا بازرگانییەكان دروست بكەیت.

كاتێك دەتەوێت بەرگ یان كەتەلۆگ بۆ كاڵایەك بكەیت و دواتر ژمارەیەكی زۆری لەچاپخانە لێی چاپ بكەیت, ئەوا پەنا ببەرە بەر بەرنامەی مایكرۆسۆفت پەبلیشەرو بەدەستی خۆت كەتەلۆگ بۆ بەرهەمەكانت دروست بكە.

1– سەرەتای كار بەرنامەی پەبلیشەر بكەرەوە, پاشان لەلای دەستە چەپ كلیكی فەرمانی Publications for Print بكە .



2– تێبینی دەكەیت كۆمەڵێك فەرمانی جیاجیات بۆ دەردەكەوێت تۆ كلیكی فەرمانی Catalogs بكە.



3– لەوكۆمەڵە قاڵبەی دانراوە یەكێكیان دەبڵ كلیك بكە, هەریەك لەو قاڵبانە بۆ شتێك دانراوەو دەتوانیت بەئارەزووی خۆت بیانگۆڕیت و دەستكارییان بكەیت, بۆنموونە ئێمە دەمانەوێت كەتەلۆگێك بۆكارگەیەكی هەمبەرگر دروست بكەین , ئەم قاڵبە هەڵدەبژێرین و دەستكاری دەكەین , واتە ئەو قاڵبەی نووسراوە Bubbles Catalog



## تێبینی:

واچاكە پێش ئەوەی دەست بكەین بە دەستكاریكردنی قاڵبە ئامادەكراوەكەمان درێژی و پانی قاڵبەكەمان دیاری بكەین بۆئەوەی لەكاتی چاپ كردندا بە قەدئەوقەبارەیە دەرچێت, كە بۆ كاڵاكەی دروست دەكەین.

4– بۆ دەستنیشانكردنی درێژی و پانی قاڵبەكە دەبڵ كلیك لەسەر چوارچێوە سەرەكییەكەی قاڵبەكە دەكەین :



**تێبینی زۆر گرنگ : پێویستە سەرەتا بەر لەهەر كارێك پێوانەكانت بكەیت بە سانتیمەتر, بۆئەم مەبەستە بچۆرەسەر** Tools>Options .



* ئینجا ئەم بۆكسەت بۆدێت و لەلیستی General, كە ئەكتیڤە لەسەری Centimeters دیاری بكەو پاشتر لەخوارەوە كلیكی ok بكە.




5– ئینجا دەبڵ كلیك لەسەر چوارچێوەی تێكستە سەرەكییەكە دەكەین و ئەم بۆكسەمان بۆدێت و لەوێدا كلیكی Size دەكەین:



6- پاش کلیك کردن لە لیستی Size ئەم بۆکسە دەبینین و دەستکاری درێژی و پانی دەکەین:




بۆنموونە سایزەکەی دەکەین بە 18بە 10 واتە درێژی 18سم و پانی 10سم.



7– ئەوەتا کەمێك سایزەکەی گەورەبوو , ئیستا کاتی ئەوەیە نووسینەکان

بنووسین و وێنەی پێویستی بۆ دابنێین:



باوایدانێین کارگەی هەمبەرگرەکە بەناوی (کوردستان)ە , سەرەتا لەسەرەوە

دەنووسین : **خواردنی هەموو ژەمەکان**



8- ئینجا لێرە ناوی کارگەکە دەنووسین :




8- دواتر دێین لەخوارەوە چیمان دەوێت دەینووسین, لێرە ڕێنمایی پێویست دەنووسین , لەخوارەوەش کاتی دروستکردن و ئێکسپایەربوونی بەرهەمەکە دەنووسین:



9- ئیستا لەخوارەوە تێكستێك دادەنێین و ناونیشانی كارگەكە دەنووسین



بۆنموونە : هەولێر – شێخەڵاً
تەلەفۆن:0000000000

10- لەدوا هەنگاودا دەچین ئەو وێنەیەی هەمانە لایدەبەین و ئەو وێنەیەی خۆمان دەمانەوێت دەیهێنین, سەرەتا وێنەكە سەلێكت دەكەین و Delete ی دەكەین:




11- بۆهێنانی وێنە دەچین كلیكی ئایكۆنی Picture Frame دەكەین, كە لەناو شریتی objects دایە:



12– پاشان Picture Frame File بکە و نیشانەی + ت بۆ دروست دەبێت و بەو نیشانەیە لەناو قاڵبەکە کلیك بکە بۆ دەرکەوتنی بۆکسی وێنە:




ئەم بۆکسەت بۆدێت و وێنەکەتی لێوە بهێنە.



13– ئەوەتا وێنەکە هات پێویستە گەورەی بکەیت و بۆجوانکاری زیاتر کەمێك لاری بکەرەوە , بۆئەم مەبەستە سوود لەو نیشانە سەوزە وەربگرەو بەهۆیەوە وێنەکە لاربکەرەوە:



14– دوای گەورەکردن و دەستکاریکردن بەمجۆرەی لێهات:



15– بۆ ئەوەی بەجوانی ئەنجامی كارەكەمان ببینین كلیكی Print Preview دەكەین:



**تێبینی :** بەهەمان شێوە دەتوانین دیوەکەی تری ئەم کەتەلۆگە دیزاین بکەین و پاشان لەکاتی راکێشاندا بیانکەین بە JPEG و لە پەنای یەك رایانبکێشین.

یاخود دەتوانیت بچیتە پەیجی 2و لەوێدا دیوی دووەمی کەتەلۆگەکە دروست بکەیت و سوود لەم دیزاینەی دیوی یەکەم وەربگریت.



# دروستكردنی بڕوانامەی جۆراوجۆر

كاتێك شوێنێك خولێكی بەهێزكردن و فێربوون دەكاتەوە و دواتر,كە تاقیكردنەوەی خوێندكارەكان تەواو دەبێت واتە دوای خولەكە مامۆستاكەیان بڕوانامەیەكیان پێدەبەخشێت , ئێمە لێرەدا باس لەدروستكردنی بڕوانامەی ریزلێنان و دەرچوون دەكەین:

1- بەرنامەی پەبلیشەر بكەرەوەو لەوێدا كلیك لەسەر Publications for Printبكە.



2- لەخوارەوەی كلیكی Award Certificates بكە.



3– یەکێك لەو قاڵبانە دیاری بکە, بۆنموونە ئەم نموونەیە هەڵدەبژێرین و کلیکی لەسەر دەکەین.



4– لەبانەرەکەی سەرەوەناوی ئەو شوێنە دەنووسین, کە بڕوانامەکە دەبەخشێت , بۆنموونە ئەم بڕوانامەیە ڕێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەری کوردستان دەیدات بەهەندێك ئەندامی کارا, کە لەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت خزمەتیان پێشکەش کردووە.

بەرلەهەر شتێك لەسەرەوە دەنووسین :

**ڕێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەری کوردستان**

ئینجا لەخوارەوە دەنووسین : **بڕوانامەی ڕێزلێنان**

پاشان دەنووسین : **بەڕێز / ناوی کەسێک**

دواتر دەنووسین: **ئێمە وەکو ڕێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەری کوردستان وەک وەفایەک بۆ کارو بەخششی بەڕێزت لە بواری خزمەتکردن بە کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ئەم بڕوانامەیەمان پێبەخشیت, بەوهیوایەی بەردەوام بیت لەکارو چالاکی زانستی.**



**تێبینی : زۆرگرنگە ئەم شتانە بزانیت:**

1– قاڵبەکان وادانراون بۆ زمانی ئینگلیزی بەکاربێن, بەڵام گەر ویستت بڕوانامەیەك بەکوردی دروست بکەیت لەهەندێك شوێندا پێویستت بە هێنان و کۆپیکردنی تێکست هەیە.

2– بەوجۆرەی سەرەوە ئاوها بەرێکی نووسینەکانت بنووسە.

3– ئەگەر ویستت رەنگی باكگراوندی تێكستەكانت بگۆڕیت , ئەوا بچۆ بۆ:

A / ئەو تێكستەی دەتەوێت رەنگی باكگراوندەكەی بگۆڕیت سەلێكتی بكە,

بۆنموونە ئێمە تێكستەكەی سەرەوە سەلێكت دەكەین:




B / پاشان دەبڵ كلیك لەسەر تێكستەكە دەكەین, ئەم بۆكسەمان بۆدێت:



C /سەرنج بدە رەنگ و چوارچێوەكەمان گۆڕى:




4– بۆبينينى كارەكەمان دەچين كليكى print preview دەكەين:



# دروستکردنی کارتی پیرۆزبایی

بۆئەوەی کارتێکی پیرۆزبایی تایبەت بەخۆت دروست بکەیت و بینێریت بۆ هاورێکانت , ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بکە:

1- بەرنامەی پەبلیشەر بکەرەوە کلیکی publications for print بکە.




2- ئینجا هەر لەوێدا کەمێك وەرە خوارەوە کلیکی Greeting Cards بکەو لەناو ئەم قاڵبانەدا یەکێکیان کلیك بکە.



3– بۆنموونە ئەم قاڵبە هەڵدەبژێرین و دەستکاری دەکەین:



4– ئەمەش قاڵبەکەیە و بۆنموونە بەبۆنەی جەژنی نەورۆز جەژنی نەتەوەیی گەلی کورد پیرۆزباییەك دەنووسین و پاشتر فایلەکە دەکەین بە JPEG و بەئیمەیڵ ڕەوانەی دەکەین بۆ هاوڕێیەکمان, یان پرێنتی دەکەین وبۆی دەنێرین.



5– بۆنموونە لەناو ئەم تێکستەدا چەند دێڕێکی بەمجۆرە دەنووسین:

هاوڕێی زێدە ئازیزم شۆخان

بەبۆنەی هاتنی جەژنی نەورۆزەوە گەرمترین پیرۆزبایی خۆمت

پێشکەش دەکەم و هیوادارم هەمیشە خەندە لەسەرلێوانت

بێت.

هاوڕێت

شالاو



6– ئیستا دەتوانین چەند ئامادەکاری و جوانکارییەکی تری بۆبکەین, بۆنموونە دەمانەوێت دەستکاری ڕەنگی باکگراوندو قاڵبەکە بکەین, بۆئەمەش دەچین دەبلّ کلیکی سەر تێکستەکە دەکەین , کە پیرۆزباییەکەمان تێدا نووسیوە:



کلیکی ئێرە واتە تێکستەکەی ناوەوە بکە

ئەم بۆکسەمان بۆدێت:




بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگ بۆ باکگراوندی تێکستەکەمان

دانانی چوارچێوە

بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگ بۆ چوارچێوەی تێکستەکەمان

دەستکاریکردنی قەبارەکەی

7– بۆ گۆڕینی ڕەنگی قاڵبەکە بچۆرە سەر Format> color schemes

یان لەلای دەستە چەپ و لەشریتی تاسك بین کلیکی Color Schemes

بکەو ئەم بۆکسەت بۆدێت:




8– ئیستا بەئارەزووی خۆت ڕەنگەکانی قاڵبەکە بگۆڕە:



9- ئیستا دەچین ئەو قاڵبەی دەستکاریمان کرد دەیکەین بە فۆرماتی JPEG و پاشان بەئیمەیڵ دەینێرین بۆ هاورێکەمان, یان دەچین لە رێگەی File>Print وە پرێنتی دەکەین و دەیکەینە ناو زەرف و بۆ هاورێکەمانی دەنێرین.

بۆ کردنی بە فۆرماتی JPEG دەچینەسەر File>save as




10- لەلیستی save as type بچۆ JPEG File Interchange هەڵبژێرەوکلیکی save بکە.



11– ئەوەتا فایلەکەمان کرد بە وێنە بەناوی www:




12– ئیستا دەبڵ کلیکی فایلی وێنەیی www دەکەین و ئەمەمان بۆدێت و دەتوانین پرێنتی بکەین و پاشان دەشتوانین بەئیمەیڵ ڕەوانەی بکەین بۆ کەسێك:



**تێبینی** : دەتوانین فالیەکەمان بە GIF خەزن بکەین و بچین لەناو بەرنامەیەکی ئەنیمەیشن گرتەی جولاًوی بدەینێ.

kico کتێبی داهاتووی رێکخراوی ئینتەرنیت و کۆمپیوتەری کوردستان

# فێربوونی بەرنامەی word

**بەشێوەیەکی زانستی و ئاسان**

**نووسینی : سەرکەوت پێنجوێنی**

**نـــــــاونـــــیشـــــــــــانـــــــــی**

**رێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەری کوردستان** kico

سلێمانی – بازاڕی هەورامان – پشت بازاڕی خەفاف

Mobile: 07702220060
Tel: 0532136130
kicoweb@yahoo.com